# نازی

## لە لادێکەدا





پشوی هاوین هات، زۆربەی دانیشتوانی شار دەچنە شاخ تیایدا، بۆئەوەی پشوی تیا بدەن، ئا ئەە نازییە خۆی ئامادە دەکات. لەگەڵ خێزانەکەیدا، بۆئەوەی لە گوند لەماڵی مامە /سیروان/ی چەند ڕۆژێك بەرنەسەر. لەبەیانی ڕۆژی گەشتەکەیاندا، نازی درەنگ لەخەو هەستا، لە هەمان کاتدا مندریان زۆر پەلەیەتی، ئا ئەوە هاتووە بۆئەوەی هەڵیسێنێ، پێی وت: هەستە، تەمەڵ! ڕاوەستە ، بێزارکەر مەبە، تۆ ئەزانی کە هەموو شت ئامادەیە!

هەموو جانتاکان لە سندوقی سەیارەکەدایە، ئیتر ئەم پەلە پەلەی بۆ چییە؟ باوکە لەپشتی سوکانی سەیارەکەوە دانیشتووە، دایکەش لە تەنیشتییەوە، مریشکەکە (ماتی) گوێی لە دەنگی مەکینەی سەیارەکە بوو، بەخێرایی هات، خۆی پیشاندا کە حەزدەکات هاوڕێ ی گەشتەکەیان بێت. بەڵام نازی جگە لە مندریان کەسی تر لەگەڵ خۆیدا نابات، بە مریشکەکەی ووت: لێرە بمێنەرەوە تەنها چەند ڕۆژێکی کەممان پێ دەچێت، بەخێرایی تێپەڕ دەبێت و دەگەڕێینەوە لات.





گەیشتە ماڵی مامە سیروان بەگەرمی پێشوازی لێ کردن، یەکە یەکە باوەشی پیادا کردن، پاشان ئاوڕی دایەوە لە نازی، وتی: یاخوا بەخێربێیت، ئەی ئازیزە بچکۆلەکەم، بەخێرایی گەورە بوویت!. نازی کاتێك سەردانی مامە سیروانی دەکات وەك جەژن وایە لای ئەو!


ئەم مامە چەند باشە، نیشانەی ڕازی بوون هەرگیز لەسەر ڕووخساری
لاناچێت، نازی هەرگیز بە ڕووخسارێکی گرژەوە نەیدیوە. ئەو بە پێستە
درێژو قژە ڕەشەکەیەوە، زۆر بەهێزو گەورە دیارە، ئا ئەوەتا نازی خستۆتە
سەر شانی بەخێرایی دەڕوات و دەڵێت: پێویستە کات بەفیڕۆ نەدەین !
یەڵا بۆ کێڵگەکە!

نازی تێبینی ئەوەی کرد کە ژمارەی ئاژەڵەکان لە ساڵی پێشووتر زیاتر بووە، مانگاکە گوێرەکەیەکی بچوکی بووە، بزنەکەش بەچکەیەکی هەیەو، مەڕەکەش بەرخۆلەیەکی هەیەو، هتد.... مامی نازی خستە سەر پشتی مانگاکە، نەترساو هیوای دەخواست کە دایك و باوکی ببینن! لە مامی پرسی: ئایا دەتوانم بەیانی یارمەتیت بدەم لە شیردۆشینی مانگاکەدا؟.





لەو کاتەدا مامە سیروانی خەریکی ئەوە بوو کە خواردنی دەدا بە ئاژەڵەکان گیای سەوزو جۆی دەدانێ، نازی دانیشتبوو یاری دەکرد لەگەڵ بەرخۆلە سپییە بچکۆلەکەدا. مندریان ئیرەیی کەوتە دڵیەوەو، لەبەرئەوەی دەیویست نازی تەنها گرنگی بەو بدات!.

مامە سیروان سەگێکی بچوکی هەڵگرتبوو، پێشکەشی نازی کردوو، داوای لێ کرد کە گرنگی پێ بدات، ڕازیبوو، سەگەکە خۆی هەڵدایە خوارو دەستیکرد بە ڕۆیشتن و مندریانیش شوێنی کەوت.





ئەوە یەکەمین گەشتێکە کە دەیکات بۆ دەشت و دەر. دارێکی گرتووە بە دەستیەوە، بە نەرم و نیانییەکەوە دەڕۆیشت، لە قەراغ ڕێگەکەشەوە گوڵی لێدەکردەوە، زۆر هەست بە دڵخۆشی و ئارامی دەکات. لە سروشتدا چەندەها شت سەرنجمان ڕادەکێشن: درەخت، گوڵ. سمۆرە کە سەردەکەون بەسەر دارەکاندا... ئەڵا سروشت چەند جوانە.



بەڵام بەخێرایی سەگە
بچکۆلەکە ماندو بوو، بۆیە نازی
ناچاربوو لەناو کراسەکەیدا
هەڵیبگرێت، بە مەندریانی وت:
سەیرکە ئەو بچکۆلەیە خەوی
لێکەوت، سوپاس بۆ خوا کە تۆ
گەورە بویت. دەڕۆیت و ماندو
نابیت، سەرەڕای ئەوەش تۆ
گرنگیم پێ دەدەیت و
یارمەتیشم دەدەیت!.



بۆ ڕۆژی دوایی نازی لەگەڵ مامیدا چوو بۆ بازاڕ. مندریان زۆر بێزار بوو لە زۆری خەڵك و هات و هاواریان. بەڵام بڕیاری دابوو کە نازی جێنەهێڵێت لەبەر هەر هۆکارێکیش بێت! وەك چاودێرێکی دڵسۆز بە تەنیشتییەوە دەڕۆیشت!. لە پڕێکدا هێلکەیەك کەوتە خوار لەو سەبەتەیەی کە هەڵی گرتبوو، کەوتە سەر سەری! ئای چەند بێ بەختیت مندریان!.



ئەم مژدە خۆشە چییە! مامەم ئەسپێکی بچووکی کڕیوە.

- نازی فێری سواربوونیت دەکەم و دەبیت بەسوارچاك.

مندریان ئەمەی پێخۆش نەبوو، چونکە خەمی نازی هاوڕێی بوو.



لەگەڵ ئەوەشدا کە نازی ئەمە یەکەمین جاریەتی سواری ئەسپ دەبێت نەدەترسا. چەند خۆشە سواربوونی ئەسپ و تەقە تەقی پێی کە دەیدات بە زەویدا! ئەو هەنگاوەکانی بە خێرایی دەبڕێ، لە پڕێکدا ئاوێك دێتە بەردەمی لەپڕ دەوەستێت بە خێرایی.



نازی جوان لغاوی ئەسپەکەی نەگرتبوو، بۆیە لەسەر پشتی ئەسپەکە کەوتە خوارێ و کەوتە ئاوەکەوە. دەستی کرد بە پێکەنین و، بە مەندریانی وت: پێشتر بمزانیایە ئاوام بەسەر دێت ئەوا جلی مەلەکردنم لەبەردەکردو دەستم دەکرد بە مەلە کردن!



نازی هەستی بە مانویەتی کرد، حەزیلێبوو بحەوێتەوە، مامی لەبەینی دوو درەختدا جۆلانەیەکی بۆ هەڵخست و ئەویش تیایدا ڕاکشا. حەزیلێبوو تۆزێ بخەوێ تیایدا، بەڵام نەیدەتوانی چاوەکانی لێکبنێ لەبەرئەوەی مەندریان دیارنەبوو. ئاواتی دەخواست کە زوو بگەڕێتەوە. بۆئەوەی دڵنیابێت، بۆیە داوای لەو کەروێشکە کرد، کە بەناوبانگ بوو بەخێرایی، کە بڕوات بگەڕێت بە دوایداو، شوێنەکەی بدۆزێتەوە، بیهێنێتەوە بۆلای .



# نازی

نازی پشوەکەی لە ماڵی
مامی دەباتە سەر.
زۆر خۆشحاڵ بوو بە
دیتنی ئاژەڵەکان.
مامیشی دیارییەکی
جوانی
چاوەڕواننەکراوی
بۆ ئامادەکردبوو.

لەم زنجیرەیەدا ئەم چیرۆکانەی لێدەرچووە :






ناوی کتێب: نازی لە لادێکەدا
وەرگێڕانی : پەخشان حەمە میرزا
دیزاینی: دڵشاد عەلی
ژمارەی سپاردن: ( 2608) ی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان/ سلێمانی
ساڵی ( 2009)